آنها از این قرار است:
* در مورد انسان، «تن و نفر» مانند: دو نفر سرباز آمدند. دو تن از شاگردان نیامده‌اند.
* در مورد چهارپایان «راس و سر بکار» میرود، مانند: دو راس گوسفند، هشت سر قاطر.
* در مورد شمشیر، کارد و تفنگ، «قبضه» به کار میرود. مانند: شش قبضه تفنگ. یک قبضه کارد.
* در مورد توپ و تانک «عراده» گویند. مانند: دو عراده توپ، چهار عراده تانک.
* در مورد کشتی و هواپیما، «فروند» میگویند. مانند: سه فروند کشتی. چهار فروند هواپیما.
* در مورد انگشتری و چاه، «حلقه» میگویند. مانند: یک حلقه انگشتری، دو حلقه چاه عمیق.
* در مورد دستکش و جوراب، «زوج وجفت» گویند. مانند: سه جفت جوراب. چهار زوج دستکش.
* در مورد اتومبیل، درشکه و تلفن، ساعت و اشیای خودکار، «دستگاه» گویند. مانند: دو دستگاه دوچرخه.
* در مورد عمارت و خانه، «باب» میگویند. مانند: یک باب دکان.
* در مورد تشک و لحاف و فرش، «تخته» گفته‌اند. مانند: دو تخته قالی.
* در مورد کتاب «جلد» و زمین «قطعه» و پارچه «قواره» گویند. مانند: یک جلد کتاب. دو قطعه زمین. دو قواره پارچه.

* ۳+۳= ۶: سه با سه = شش. «جمع»
* ۱۰-۷=۳: ده منهای هفت= سه «تفریق»
* ۷-۲=۵: دو از هفت = پنج «تفریق
* ۳×۳ = ۹: سه‌سه‌تا= نه تا «تا»
۵×۳= ۱۵: پنج سه تا = پانزده تا . «تا»
۱۵ ÷۳=۵: پانزده تقسیم بر سه = پنج «بر»

**توضیحات**

عدد «نه‌ده‌د» : ژماره

معدود «مەئدود»: ژمێرراو
شماره «شوّماریّ»: ژماره
راه «راه»: رێگا
پیمودیم «پێیمودیم»: پێوامان، بڕیمان
نخست «نۆخۆست»: یەکەم. سەرەتا
بخش «بەخش»: بەش
اند «ئەند»: هەند «٣-٩» نەوەد و هەندێ ساڵ ژیاوه.
قاطر «قاتێر»: هێستر
تانک «تانک»: تانک
هواپیما «هەواپێ یما»: فرۆکه.
فرودگاه «فرودگاه»: فرۆکەخانه
چاه «چاه»: بیر
دستکش «دەستکێش»: دەستکێش
جفت «جۆفت»: جووت
درشکه «دۆرۆشکێ»: گالیسکه
تشک «تۆشەک»: دۆشەک
لحاف «لەهاف»: لێفه
دوچرخه «دۆچەرخێ»: پاسکیل
قالی «قالی»: قالی، وەرته.

# ئەم کتێبە

## خوێنەری هێژا:

... هیچ پێت سەیر نەبێ گەر بڵێم هەرگیز بیرم لەوە نەکردبووەو کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دەست بدەمە دانان و ئامادە کردنی کتێبێکی لەم بابەتە. چونکە بەش بە حاڵی خۆم چونە بنج و بناوانی زمان بەکارێکی قورس دەزانم و ئەو ماوەیەشم نەبوو کە کارەکەم نەخت و پوخت و بەدڵی خۆم بێ، بۆیە وەختێ ڕێکخراوی خێرخوازی «کۆمەڵەی هیوای عێراقی» لە ١٩٩٥/٢/١١ دا دەورەیەکی فێرکردنی زمانیان کردەوە و زمانی فارسی یەکێک بوو لەو زمانانەی کە لە پرۆژەکەیاندا بوو، و ڕویان لە من نا کە زمانی فارسییەکە بڵێمەوە، زۆرم پرس و ڕا لەگەڵ خۆم دا کرد، دوو دڵ بووم لەوەی کە بچمە ژێر ئەو بارە قورسە یان نا! کە چووم دەرەقەت دێم یان نا! بڕیاردان قورسە! زمانیش زەحمەتە لە ماوەی «٤٠» سەعات دا بگوترێتەوە، چونکە بۆ فێربوونی هەر زمانێک بەلای کەمەوە دەبێ سێ قۆناغ لەبەرچاو بگیرێ، فێربوونی دەنگەکان «فۆنیم» فێربوونی لایەنی مورفۆلۆجی زمان کە بریت یە لە لێکۆڵینەوەی وشە لە دەرێ ی ڕستەدا و ئەوجا فێربوونی لایەنی سینتاکسی زمان کە بریتی‌یە لە مامەڵەکردن لە تەک وشەدا، لەناو ڕستەدا و بە جۆرێکی هاوپەیوەند لەگەڵ وشەکانی تری ناو ڕستەدا.

بە هەرحاڵ، بە نە بەدڵی یەوە، کارەکەم وەئەستۆ گرت و شانم لێ قایم کرد، ئەوجا ما بیر لەوە بکەمەوە چۆن ئەم «٤٠» سەعاتە بە فیڕۆ نەدەم و ئەوپەڕی سوود بە فێرخوازان بگەیەنم. هەرچی سەرم هێناو سەرم برد «٤٠» سەعات بەشی ئەو سێ قۆناغە ناکات کە من بە تەمای بووم. بۆیە هەستام هەردوو قۆناغی فێربوونی دەنگەکان و مورفۆلۆجیم بەشێوەیەکی زۆر چڕ وپڕ لێکدا و هەر بۆخۆیی چێشت ناورم لەلایەنی

سێنتاکسی دایەوە و دوای چل سەعات کار کردن و خوێندنەوەی چەندین سەرچاوە بۆ ئەم مەبەستە، ئەم کتێبە هاتە بەرهەم. لەم کتێبەدا تەنیا هەوڵی ئەوەم داوە فێرخوازان بخەمە سەر راستە رێگەی فێربوون و هەنگاوانی پاشترم وەنەستۆی خۆیان خستووە.

جا ئەگەر ئەم نیشانەیەم ئەنگاوتبێ، خۆم بە بەختیار دەزانم و هیوادارم مامۆستا و شارەزا و پسپۆران، لە چوارچێوەی ئەو مەبەستەدا کە کتێبەکەی بۆ دانراوە، بە سەرنج و تێبینی و پێشنیازی خۆیان چاپی دووەمی ئەم کتێبە ئەگەر کرایەوە- دەوڵەمەند بکەن و پێشوەختە خۆم بە منەتبار دەزانم.

هیڤی سەرکەفتن ژ بۆ هەموو لایەک دەخازم

**حەمەکەریم عارف**
**سلێمانی**
**١٩٩٥/٣/٢٤**

کورتەیەک لەمەڕ زمان و ڕێزمانی فارسی و ئەلف و بێی فارسی.
* دەستوری «ڕێزمان» زمان چی‌یە؟
- دەستوری زمان، زانستێکە کە فێری ئاخافتن و دروست نوسینمان دەکات.
دەستوری زمان بە شێوەیەکی گشتی لە دوو بەش دا دەخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە.
١- باسی مورفۆلۆجی «تەجزیە»
٢- باسی سێنتاکسی « تەرکیب»
**باسی مورفولۆجی «تەجزیە»:**
ئەگەر لە دەرێی ڕستەدا و بە تەنیا لە ووشە بکۆڵینەوە و گفتوگۆی لەسەر بکەین، ئەوا خستومانەتە بەرباسی مورفۆلۆجی.
**باسی سێنتاکسی «تەرکیب»:**
بریتی‌یە لە لێکۆڵینەوەی ووشە لە ناو ڕستەدا و بە شێوەیەکی هاوپەیوەند لەگەڵ ووشەکانی‌تری نێو ڕستەکەدا.
نوکە بڕوانە ئەم ڕستەیەی خوارەوە و سەرنج بدە کە چۆن هەردوو باسی مورفۆلۆجی و سێنتاکسی «تەجزیە و تەرکیب» ی بە سەرا جێبەجێ دەکەین: « بڕوانە فارسیەکە = ب.ف».
هەر زمانێک بۆ ئاخافتن و نوسین پێویستی بە ووشە هەیە. هەر ووشەیەکیش لە ژمارەیەک پیت پێک هاتووە.
لە زمانی فارسیدا «٣٣» پیت بەکار دێت کە بریتین لە: «ب.ف = بڕوانە فارسیەکە.»
لەم (٣٣) پیتە «٨» هەشتیان تایبەتن بە زمانی عەرەبی و هاتونەتە ناو زمانی فارسییەوە «ب.ف.»
هەروەها لەم «٣٣» پیتە «٤» چواریان تایبەتن بە زمانی فارسییەوە.
پیتەکانی دی، پیتی هاوبەشن لە نێوان هەردوو زمانی فارسی و عەرەبی‌دا.
سەرنج:
١- «واو» مەعدولە: پیت «و» هەندێ جار دەنووسرێ بەڵام ناخوێنرێتەوە و پێی دەڵێن «واو»ی مەعدولە. «ب.ف».
پێش «واو»ی مەعدولە هەمیشە پیتی «خ» دێت و دوای ئەو «واو» یەکێک لەم پیتانە دێ: «ا، و،ر،ز،ش، ن، هـ، ی،» وەک: «ب.ف».

ئەگەر لە دوای واوی مەعدولەوە پیتی «ئەلف» بێت، ئەوا واوەکە وەکو « ا» دەخوێنرێتەوە. وەک «ب.ف». ئەگەر دوای واوی مەعدولە پیتی «ی» بێت، ئەوا واوەکە وەک «ی» دەخوێنرێتەوە. وەک «ب.ف».

**٢- «ە» درکا و نەدرکاو**

أ- «ە» ی درکاو «ملفوظ» ئەوەیە کە دەنوسرێ و دەخوێنرێتەوە، ئەم پیتە لە سەرەتاو ناوەڕاست و کۆتایی وشەوە دێت، وەک «ب.ف».

ب- «ە»ی نەدرکاو «غیر ملفوظ» : ئەوەیە کە دەنووسرێ بەڵام ناخوێنرێتەوە و تەنیا لە کۆتایی وشەوە دێ. وەک : «ب.ف»

ج - پیتی (ة) کە تایبەتی ووشە عەرەبی‌یەکانە. ئەم پیتە لە زمانی فارسیدا هەندێ جار وەک «ە»ی نەدرکاو دەنوسرێ و دەخوێنرێتەوە، واتە هەمان مامەڵەی «ە»ی نەدرکاوی لەگەڵ دەکرێ. وەک : «ب.ف». ئەم پیتە «ة» هەندێ جاری دێ بە شێوەی «ت» دەنووسرێ و دەخوێنرێتەوە. وەک : «ب.ف».

د- ئەو ووشانەی کە بە «ە»ی نەدرکاو کۆتاییان دێ، هەر گاڤێ «ی» چاوگییان بخرێتە دوا، ئەو «ە» کە دەگۆڕێ بە «گ». وەک : «ب.ف»

هـ- ئەگەر ووشەیەک بە «ە» نەدرکاو کۆتایی بێت، هەرگاڤێ بدرێتە پاڵ ووشەیەکی دی، نیشانەی هەمزە لەسەر «ە» کە دادەنرێ و وەکو «یا» دەخوێنرێتەوە و بەم شێوەیە دەنوسرێ. وەک : «ب.ف».

**ڕستە**

مرۆڤ هەمیشە مەبەستی خۆی لە شێوەی ڕستەدا دەردەبڕێ. هەر کاتێ چەند ووشەیەک بە دەم یەکەوە بێن و مانا و چەمکێکی تەواو بگەیەنن، پێی دەڵێن ڕستە. وەک : «ب.ف». ڕستە لە رووی ناودرۆک و بابەتەوە، دووجۆرە:

**١- ڕستەی فرمانی:**

ئەوەیە لەروی کە فرمانێکی تەواوی تێدا بێ. وەک : «ب.ف».

**٢- ڕستەی ناوی:**

ئەوەیە کە فرمانی پەیوەستی تێدا بێ. وەک : «ب.ف».

ڕستە لە روی پێکهاتەوە «بیناوە» دەبێ بەسێ بەشەوە:

**١- ڕستەی سادە:**

ئەوەیە کە یەک فرمانی تێدا بێ و ماناو چەمکی تەواو بگەیەنێ. وەک : «ب.ف».

**٢- ڕستەی ناتەواو:** ئەوەیە کە ماناکەی تەواو نەبێ. وەک : «ب.ف».
**٣- ڕستەی لێکدراو:** ئەوەیە کە لە فرمانێک پتری تێدا بێ. وەک : «ب.ف».
**تێبینی:**
لەو ڕستەیەی سەرێ را «ب.ف» لە فرمانێک پتر هەیە و دوو جۆرە ڕستەش هەیە. یەکێکیان پارستە و ئەوی تریان شارستەی پێدەڵێن.
**شارستە:** ئەوەیە کە مەبەستی سەرەکی بگەیەنێ و مانای تەواو بەدەستەوە بدات.
**پارستە:** «ڕستەی پاشکۆ = پەیرەو» : ئەوەیە کە بۆ مەبەستی تەواوکردنی واتای شارستە بەکار دێت. «ب.ف».
**مصدر «چاوگ»**
چاوگ، ئەوەیە کە ئەنجامدانی کارێک یا دەرخستنی حاڵەتێک، بێ ئەوەی کات یا کەس «بکەر»ی مەبەست بێ، دەربڕێ و بنوێنێ.
نیشانەی چاوگ «دن» یا «تن»ە، کە ئەگەر «ن»ەکەی لێ لابرێ، فرمانی ڕابوردوی سادە دەمێنێتەوە. وەک: «ب.ف».
**جۆرەکانی چاوگ**
**١- چاوگی بنجی:** ئەوەیە کە لە بنج و بناوان دا چاوگ بێ. ئەگەر «ن» بخرێتە سەر ڕەگی فرمانی ڕابوردووی سادە، ئەوا چاوگی بنجی لێ دروست دەبێ و نیشانەکەشی یا «دن» یا «تن»ە. وەک : «ب.ف».
**٢- چاوگی دروستکراو:**
ئەوەیە کە لە بنەڕەتدا چاوگ نەبووە، بەڵکو پاشگری «یدن» خراوەتە سەر کۆتایی ووشەی فارسی و عەرەبی و ئەم چاوگەی لێ بەدەست هاتووە. وەک «ب.ف».
**٣- چاوگی سادە:**
ئەوەیە کە لەووشەیەک پتر نەبێ. وەک : «ب.ف».
**٤- چاوگی لێکدراو:**
ئەوەیە کە لە ووشەیەک پتر پێک هاتبێ. وەک : «ب.ف».
**٥- چاوگی سوک کراوە:**
ئەوەیە کە «ن»ی نیشانەی چاوگی لێ لابرێ و هەمان مانای چاوگیش بگەیەنێ وەک : «ب.ف».
چەند سەرنجێک لەمەڕ چاوگ و ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر فرمانی

داخوازی و هاوپەیوەندەکانی دا دێ.
هەمیشە بەر لە نیشانەی چاوگ، یەکێک لەم یازدە پیتەی دەستەواژەی «زمین خوش فارس» دێت و ئەم پیتانە بە زۆری لە فرمانی داخوازی و هاوپەیوەندەکانی دا، بەم شێوەیەی خوارەوە دەگۆڕێن.
١- «ز»: وەکو خۆی دەمێنێتەوە. وەک : «ب.ف».
٢- «م»: لا دەبرێ. وەک : «ب.ف»
٣- «ی»: لادەبرێ. ٠ەک : «ب.ف»
لە دەستور بەدەر « ناوێزە» «ب.ف».
٤- «ن»: بەدەقی خۆیەوە دەمێنێتەوە . وەک : «ب.ف».
٥- «خ»: دەگۆڕێ بە «ز». وەک : «ب.ف». لەدەستور بەدەر «ناوێزە» «ب.ف»
لەچاوگی «پختن» دا ئەگەرچی «خ» بۆ «ز» گۆڕاوە بەلام چونکە لە بنجی ووشەکەدا گۆڕانکاری روی داوە، بۆیە بە ناوێزەو لە دەستور بەدەر ژمێردراوە.
٦- «و»: دەگۆڕێ بۆ «ئەلف» و لە دوای ئەلفەکەوە بەزۆری «ی» زیاد دەکرێ. وەک : «ب.ف».
لە دەستور بەدەر «ناوێزە» «ب.ف»
٧- «ش» ئەگەر پاش «ئەلف» بێت دەگۆڕێ بۆ «ر» وەک : «ب.ف».
لە فرمانی داخوازی «داشتن» دا ئەمڕۆکە لەبری «دار» «داشتە باش» بەکار دەهێنرێ.
«ش» ئەگەر لە پاش «ئەلف»ەوە نەیەت، دەستوری تایبەتی نی یە، وەک : «ب.ف».
٨- «ف» دەگۆڕێ بە «ب» وەک : «ب.ف».
لە دەستور بەدەر «ناوێزە» «ب.ف»
٩- «ا» لادەبرێ وەک : «ب.ف».
لە دەستور بەدەر «ناوێزە» «ب.ف»
١٠- «ر» وەکو خۆی دەمێنێتەوە و هەندێ جاریش «ئەلفێکی» لەپێشەوەی بەکار دێنن: وەک : «ب.ف».
لەدەستور بەدەر «ناوێزە» «ب.ف»
لە ووشەی «بردن» دا ئەگەر چی « ر» وەکو خۆی ماوەتەوە بەلام چونکە گۆڕانکاری لە بنجی ووشەکەدا رووی داوە، بۆیە بە ناوێزە هاتۆتە ژماردن.

۱۱- «س» ئەگەر پێش «س»ە کە بۆر بێ ئەوا دەگۆڕێ بۆ «و» و هەندێ جاریش «ی» بە دوا دا زیاد دەکرێ وەک : «ب.ف»
خۆ ئەگەر پێش «س»ە کە بۆر نەبێ، ئەوا لەم چوار نمونەیەی ژێرەوەدا دەگۆڕێ بە «ه». وەک : «ب.ف».
لەم هەشت نموونەیەشدا، «س» ە کە لا دەبرێ. وەک : «ب.ف».

**فرمان**

**فرمان:**

ووشەیەکە دەلالەت لە روداني کارێک دەکات لە یەکێک لە کاتەکانی رابوردوو، ئێستا، داهاتوودا. وەک:«ب.ف».
بەپێی ئەو پێناسەیەی سەرێ هەر فرمانێک پێویستە سێ چەمکی بنەڕەتی بگرێتە خۆ:
۱- کار یا حاڵەت
۲- کات
۳- کەس «ئەنجام دەری کار»
وەک فرمانی «رفت» کە هەر سێ چەمکەکەی سەرێی گرتۆتە خۆ:
۱- رفتن= کارو حاڵەت.
۲- چەمکی کات لەم فرمانە= کاتی رابوردوو.
۳- مانای کەسیش وەکو لە فرمانەکەدا دیارە «ئەو»ە.
وەکو لە پێناسەی فرمان دا ئاشکرا بوو، یەکێک لە چەمکەکانی بریتیە لە کەسی ئەنجام دەری کار، کە فرمانەکەی دەدرێتە پاڵ. ئەم کەسانە لە زمانی فارسیدا بە «٦» شێوە دەردەکەوێ و پێیان دەگوترێ راناوی کەس.

| | |
|---|---|
| **یەکەم کەسی تاک** | **یەکەم کەسی کۆ** |
| **دووەم کەسی تاک** | **دووەم کەسی کۆ** |
| **سێیەم کەسی تاک** | **سێیەم کەسی کۆ** |

«بڕوانە فارسییەکە = ب.ف»

**فرمان لە روی کاتەوە:**

فرمان لە رووی کاتەوە دەبێ بە سێ بەشەوە.
۱- فرمانی رابوردوو.
۲- فرمانی رانەبوردوو.
۳- فرمانی داهاتوو.

**فرمانی رابوردوو:**

ئەوەیە کـە دەلالەت لە رودانی کـارێک لەکـاتی رابوردودا دەکـات. وەک: «ب.ف».

فرمانی رابوردوو «٥» جۆرە:

**١- رابوردی سادە:**

ئەوەیە کـە دەلالەت لەروودانی کـارێک لە رابوردودا بکات. چۆنێـتی دروستکردنی: چاوگ -ن= رابوردوی سادە.

**٢- رابوردوی بەردەوام:**

ئەوەیە کـە بە شێـوەیەکی بەردەوام دەلالەت لە رودانی کـار لە کـاتی رابوردودا بکا. نیشانەکەشی پێشگری «می»یە کە دەچێتە پێش رابوردوی سادە.

چۆنێتی دروستکردنی: می+چاوگ - ن = رابوردوی بەردەوام.

**٣- رابوردوی نەقلی:**

ئەوەیە کـە دەلالەت لە رودانی کـارێک لە رابوردیەکی تەواودا دەکـات. وەک: «ب.ف».

چۆنێـتی دروسـتکردنی چاوگ -ن+ە+ گـەردانی «است»= رابوردوی نەقلی.

**٤- رابوردوی دور:**

ئەوەیە کە کاتی رودانەکەی دور بێ و بە کۆمەکی «بوون» گەردان دەکرێ.

چۆنێتی دروستکردنی: چاوگ - ن+ە+ بود= رابوردوی دور.

**٥- رابوردوی ئیلتزامی:**

ئەوەیە کە رودانی کارێک لە رابوردودا بە شێوەی گومان و دوو دڵی یا نومێد و ئارەزوو بەیان بکات.

چۆنێـتی دروسـتکردنی: چاوگ - ن+ە+ گـەردانی «باشـد» = رابوردوی ئیلتزامی.

**فرمانی رانەبوردو و جۆرەکانی:**

فرمـانی «مضارع» ئەوەیە کە لە نێوان ئێستا و ئایندەدا هاوبەش بێ و روودانی کارێک یا رودانی حالەتێک لە کاتێ ئێستا یان ئایندەدا بنوێنێ. وەک: «ب.ف».

فرمانی رانەبوردوو «مضارع» دوو جۆرە:

**١- رانەبوردوی ئیخباری:**

ئەوەیە کـە رودانی کـارێک بە شـێـوەی هەواڵێکی لە گـومـان بەدەر

دەربڕێ. وەک: «ب.ف».
**چۆنێتی دروستکردنی:**
می+ رەگی مضارع+ راناوە بکەرییەکان «م، ی، د. یم، ید، ند»
**٢ – رانەبوردوی ئیلتزامی:**
ئەوەیە کە بەشێوەی گومان و دوودڵی، تکاو ئارەزوو کارێک بنوێنێ.
وەک: «ب.ف».
**چۆنێتی دروستکردنی:**
ب+رەگی مضارع+ راناوی بکەر= رانەبوردوی ئیلتزامی.

*

**فرمانی داهاتوو «ئاینده»**
ئەوەیە کە روداني کار تەنیا لەکاتی ئاینده دا «داهاتوو» بنوێنێ.
وەک: «ب.ف».
**چۆنێتی دروستکردنی:**
گەردانی «خواستن»+ رابوردوی سادە = فرمانی ئاینده. وەک: «ب.ف».

*

**فرمانی ئەرێ ونەرێ «مثبت و منفي»**
**فرمانی ئەرێ:**
ئەوەیە کە بەشێوەی ئەرێ دەلالەت لە روداني کارێک بکا.
وەک: «ب.ف».
**فرمانی نەرێ:**
ئەوەیە کە بەشێوەی نەرێ دەلالەت لە روداني کارێک بکا.
وەک: «ب.ف».
**فرمانی داخوازی و نەهی:**
**فرمانی داخوازی:** ئەوەیە کە حوکم و ئەمر بگەیەنێ. وەک: «ب.ف».
بە جۆری نەفیی فرمانی داخوازی دەگوترێ نەهی. وەک: «ب.ف».
**فرمانی کۆمەک:**
فرمانانی «کۆمەک»، ئەوانەن کە فرمانی دی بە کۆمەک و یارمەتی دان گەردان دەکرێ. گرنگترین فرمانانی کۆمەک بریتین لە: استن. بودن. خواستن. شدن. شایستن. بایستن.
١ – استن: رابوردی ئەقلی بە یارمەتی ئەو گەردان دەکرێ.

وەک:«ب.ف».
٢- بودن: رابوردوی دورو نیلتزامی بەیارمەتی گەردان دەکری.
وەک:«ب.ف».
٣ - خواستن: یارمەتی گەردان کردنی فرمانی نایندە دەدا.
وەک:«ب.ف».
٤- شدن: فرمانی نادیاری بە هۆوە چێ دەکرێ. وەک:«ب.ف».

**فرمانی تێنەپەڕ و تێپەڕ:**

**فرمانی تێنەپەڕ:** ئەوەیە کە بەرکاری «مفعول» راستەوخۆی نەبێ و بەبکەر ماناکەی تەواو دەبێ. وەک:«ب.ف».

**فرمانی تێپەڕ:** ئەوەیە کە لە پاڵ بکەردا، بەرکاریشی هەبێ. وەک:«ب.ف».

**تێبینی:**

بەرکار، لەگەڵ فرمانی تێنەپەڕدا نایەت، بەڵکو تەواوکەری لەگەڵدا دێ.وەک:«ب.ف».

فرمانی تێپەڕ: دەشێت لەگەڵ بەرکاردا، تەواوکەریش وەربگرێ. وەک:«ب.ف».

**فرمانی دیار و فرمانی نادیار:**

١- هەر فرمانێ کە بدرێتە پاڵ بکەر، و بکەرەکەی دیار و ئاشکرا بێ فرمانی دیاری پێ دەڵێن، وەک:«ب.ف».
٢- هەرکاتێ فرمان بدرێتە پاڵ بەرکار، پێی‌دەگوترێ فرمانی نادیار. وەک:«ب.ف».

**چۆنێتی دروستکردنی:**

چاوگ- ن+ە+ گەردانی شدن= فرمانی نادیار.

**تێبینی:** تەنیا فرمانی تێپەڕ دەکرێ بە نادیار، چونکە فرمانی تێنەپەڕ، بەرکاری نیە، تا فرمانەکەی بدرێتە پاڵ.

بۆ بە تێپەڕ کردنی فرمانی تێنەپەڕ، رێبازی دەستوری تایبەتی هەن کە لەجێی خۆیدا دەچینەوە سەری.

**راناو و بەشەکانی:**

راناو، ووشەیەکە کە جێی ناوێک بگرێتەوەو، نەیەڵێ ئەو ناوە دووبارە ببێتەوە. وەک:«ب.ف».

**مەرجەعی راناو:**

ئەو ووشەیەی کە راناوەکە جێی بگرێتەوە پێی دەڵێن مەرجەعی راناو. بۆ وێنە ووشەی «کوردۆ» لە نمونەکەی سەرێ را، مەرجەعی راناوی پێ دەڵێن وەک: «ب.ف».

ئەو راناوانەی بۆ ئێرە پێویستن و بە کەڵکی دەرسەکەمان دێن بریتین لە «٣» جۆر:

١- راناوی کەسی ٢- راناوی ئیشارەت ٣- راناوی هاوبەش.

**راناوی کەسی:**

ئەوەیە کە جێی ناو دەگرێتەوە و شەش جۆرە پێکهاتی هەیە و دەبێ بە دووبەشەوە:

١- راناوی کەسی سەربەخۆ «جیا» کە بریتین لە:

| | |
|---|---|
| یەکەم کەسی تاک | یەکەم کەسی کۆ |
| دووەم کەسی تاک | دووەم کەسی کۆ |
| سێیەم کەسی تاک | سێیەم کەسی کۆ |

«ب.ف»

**٢- راناوی لکاو:**

ئەوەیە کە بە ووشەیەکی پێش خۆیەوە بلکێ. ئەمەیش دووجۆرە:

أ- دەستەیەک کە تەنیا بە فرمانەوە دەلکێ و لەشێوەی بکەردا دێت و «راناوی بکەر» یان پێ دەڵێن، کە بریتین لە: «م.ی.د.یم. ید. ند.» «ب.ف»

**تێبینی:**

١- راناوی لکاوی «د» سێیەم کەسی تاک لەگەڵ فرمانی رابوردا بەکار نایەت.

٢- لەو شوێنانەدا کە مەرجەعی راناو «کەس = ناقل» بێ، بە زۆری راناوی «او» و ئەگەر «کەس نەبێ» راناوی «ان» بەکار دەهێنرێ. وەک: «ب.ف».

ب- دەستەیەکی دی کە بە فرمان و ووشەی تریشەوە دەلکێن و بەزۆری دوو حاڵەت یا دوو رۆڵ دەگێرێ.

١- حاڵەتی بەرکاری «مفعول»

٢- حاڵەتی ئیزافە.

ئەم جۆرە راناوانە بریتین لە:

«م.ت.ش.مان. تان. شان.»

**تێبینی:**

١- ئەم جۆرە راناوە لکاوانە ناتوانن رۆڵی بکەری رستە ببینن.

٢- ئەگەر ئەو ناوەی بۆ راناوی لکاو ئیزافە دەکرێ، بە پیتی «ە» کۆتایی هاتبێ، دەبێ «ئەلفێک» بخرێتە کۆتایی ناوەکەوە و ئەمجا بۆ راناوەکە ئیزافە بکرێ. وەک: «ب.ف».

**راناوی ئیشارەت:**

راناوێکە کە ئیشارەت و ئاماژە بگەیەنێ و دوو پێکهاتی هەیە: وەک: «ب.ف».

١- این: بۆ ئیشارەتی نزیک بەکار دێ. ٢- آن: بۆ ئیشارەتی دور بەکار دێ. وەک: «ب.ف».

**تێبینی:**

١- لە کۆکردنەوەی «این و آن» دا ئەگەر مەرجەعی راناوەکە «ناقل بێ» دەکرێن بە «اینان، آنان» و ئەگەر «ناناقل» بێ دەکرێن بە «اینها و آنها»

٢- «این و آن» هەر گاڤێ لەگەڵ ناودا بەکار بێن دەبن بە «ناوی ئیشارەت» و هەرکاتێ جێی ناو بگرنەوە راناوی ئیشارەتیان پێ‌دەڵێن. وەک: «ب.ف».

٣- هەرکاتێ پیتی «با» ی ئیزافە بخرێتە پێش «این، آن» پیتی «دال» دەکەوێتە نێوانیان وەک: «ب.ف».

٤- «همین و همان» ش بەشێکن لە راناوی ئیشارەت.

٥- لە هەندێ ووشەدا لەبری «این»، «م» بەکار دێن کە لە کۆنا باو بوە و وەکو ناوی ئیشارەت بەکار هاتوە، بەلام ئێستا بەکار ناهێنرێ. وەک: «ب.ف».

**راناوی هاوبەش:**

ئەوەیە کە لە نێوان یەکەم و دووەم و سێیەم کەسی تاک و کۆدا هاوبەش بێ و هەمیشە بەشێوەی تاک بەکار دێت و بریتیە لە: «خود، خویش، خویشتن». وەک: «ب.ف».

**ناو**

ناو، ووشەیەکە کە بۆ ناونانی مرۆڤ یا گیانلەبەر یا شتێک بەکار دێت. وەک: «ب.ف».

ناویش، چەند جۆرێکی جیاوازی هەیە:

**١- ناوی گشتی:** ئەوەیە کە بۆ خەڵکانی هاورەگەز یا شتی هاوجۆر بەکار دێت و لەبەر ئەمە ناوی رەگەزیشی پێ دەگوترێ. وەک: «ب.ف».

٢- ناوی تایبەتی: ئەوەیە کە بۆ ناوی کەس یا گیانلەبەر یا شتێکی دیاریکراوو تایبەت بەکار دێت و ناوی عەلەمیشی پێ دەڵێن. وەک: «ب.ف».

**٣- ناوی زات:** ئەوەیە کە بونی بە بونی شتێکی دیەوە بەند نەبێ. وەک: «ب.ف».

**٤- ناوی مەعنەوی:** ئەوەیە کە بونی بە بونی شتێکی دیەوە بەسترابێ. وەک: «ب.ف».

**٥- ناوی سادە:** ئەوەیە کە لە یەک ووشەی واتاداری سەربەخۆ پێک هاتبێ. وەک: «ب.ف».

**٦- ناوی لێکدراو:** ئەوەیە کە لە ووشەیەک زیاتر پێک هاتبێ. وەک: «ب.ف».

**٧- ناوی ناسراو:** ووشەیەکە کە لەلای گوهدار تەواو ئاشکرا و ناسراو بێ. وەک: «ب.ف».

**تێبینی:**

ناوی تایبەت. ئەو ناوانەی بە «این و آن» تەواو دەکرێن، مەرجەعی راناوی کەسی. بانگ کراو.. هەموو ناوی ناسراون. زۆربەی ئەو ناوانەی کە نیشانەی ئەشوناسیان پێوە نەبێ، بەناوی ناسراو دێنە ژماردن.

**٨- ناوی نەناسراو:** ئەوەیە کە لای گوهدار «مخاطب» دیارو ناسراو نەبێ. ئەم ناوە چەند نیشانەیەکی هەیە، وەک: «یک و یکی» لەسەرەتای ووشەوەو «ی» لە کۆتایی ووشەوە. وەک: «ب.ف».

**٩- ناوی بچوک کراوە:**

ئەوەیە کە دەلالەت لە بچوکی بکات و چەند نیشانەیەکی هەیە کە بریتین لە: «ب.ف».

شایانی باسە کە پیتی «ک» بۆ سێ مەبەست بەکار دێت. وەک: «ب.ف».

**١٠- ناوی تاک:** ئەوەیە کە بۆ یەک مرۆڤ یا یەک گیانلەبەر یان یەک شت بەکار بێت. وەک: «ب.ف».

بەلآم ئەگەر ناوێک دەلالەت لە یک مرۆڤ یا گیانلەبەر یا شت بکات پێی دەگوترێ کۆ.

**١١- ناوی کــــۆ:** ئەوەیە کــە لە روالەتدا تاک و لە واتادا کــۆیێ. وەک: «ب.ف».

**١٢- نــاوی چــاوگ:** ووشـەیەکە بەبێ نیشـانەی «تن و دن»ی چاوگ، مانای چاوگ بگەیەنێ. دەبێ ئاگات لەو خالە بێ کە ناوی چاوگ قیاسی نیە و ناتوانێ لە هەموو چاوگەکان، ناوی چاوگ دروست بکەی.

ناوی چاوگ چەند نیشانەیەکی هەیە کە دیارترینیان بریتێن لە:

١- ش. وەک: «ب.ف».

٢- ی. وەک: «ب.ف».

٣- ه.وەک: «ب.ف».

٤- ار. وەک: «ب.ف».

**١٣- ناوی ئامێر:** ئەوەیە کە دەلالەت لە ئامێری کار بکات. ناوی ئامێر و چۆنیــەتی دروســتکردنی لە زمـانی فـارسی دا دســتوری تایبـەتی نیـە. وەک: «ب.ف».

**ناوی ئامێر، سێ جۆرە:**

١- جامد: ئەوەیە کە لە رەگی فرمانەوە وەرنەگیرابێ. وەک: «ب.ف».

٢- مشتق: ئەوەیە کە لە رەگی فرمانەوە وەرگیرابێ. وەک: «ب.ف».

٣- لێکدراو: ناوی گـشـتی+رەگی مـضــارع= ناوی ئامـێری لێکدراو. وەک: «ب.ف».

**دەستوری کۆکردنەوەی ناو**

لە زمانی فارسیدا دوو جۆرە نیشـانەی کۆ هەیە «آن، ها».

١- گیانداران بە «ان» کۆ دەکرێنەوە. وەک: «ب.ف».

٢- بێ گیانان بە «ها» کۆ دەکرێنەوە. وەک: «ب.ف».

٣- هەندێ ئەندامی لەشــیش هەندێ جــار بە «ان» کــۆ دەکــرێنەوە. وەک: «ب.ف».

٤- ووشــەیەک کــە بە «ا» یان «و» کــۆتایی بێت، لە حــالەتی بە کـۆکـردنیـاندا بە «ان» پیـتی «ی» دەخـرێتـە پێش نیـشـانەی کـۆیەکـە. وەک: «ب.ف».

هەندێ ووشە هەن لەم دەستورە بەدەرن. وەک: «ب.ف».

٥- آ: هەندێ ناوەڵناوو ناوی گیانداران کە بە «ە»ی نەدرکاو کۆتاییان دێت، ئەگەر بمانەوێ بە «ان» بیانکەین بە کۆ، «ە» کە دەگۆڕێ بە «گ» و ئەوجا «ان» ی بۆ زیاد دەکەین. وەک: «ب.ف».
ب: ئەو وشانەی کە کۆتاییەکەیان «ە» ی نەدرکاوە، هەر گاڤێ بە «ها» بکرێن بە کۆ، دەبێ «ە» نەدرکاوەکەش بێتە نووسین. وەک: «ب.ف».

*

**ناوەڵناوو بەشەکانی**

ناوەڵناو: ووشەیەکە وەسفی ناوێک بکات و چۆنیەتی حاڵەتی ناوەکە نیشان بدات. وەک: «ب.ف».

کە ناوەڵناوێک دەدرێتە پاڵ ناوێک، ناوەکە، وەسف کراوی پێ دەڵێن. وەک: «ب.ف».

هەندێ ناوەڵناو لەگەڵ ناودا هاوبەشە، واتە هەندێ جار وەک ناوو هەندێ جار وەک ناوەڵناو بەکار دەبرێ. وەک: «ب.ف».

**تێبینی:**

١- بەشێوەیەکی گشتی ناوەڵناو لە دوای ناوی وەسف کراوەوە دێت. ووەک: «ب.ف». بەڵام هەندێ جار ناوەڵناو لە پێش وەسف کراوەوەش دێت. وەک: «ب.ف».

٢- ناوەڵناو لەروی تاک و کۆوە، وەکو وەسف کراوەکە، نابێ. وەک: «ب.ف».

٣- ئەگەر وەسف کراوێک چەند ناوەڵناوێکی بە دوادا بێ، لەم حاڵەتەدا بە زۆری لە شێوەی ئیزافەدا دادەڕێژێ و یا دەبێ نیشانەی «ـ» ژێر بخرێتە کۆتایی هەر ناوەڵناوێک یا دەبێ بە یارمەتی ئامرازی پەیوەندی «و» ناوەڵناوەکان بە دوی یەک دابێن. وەک: «ب.ف».

٤- بە شێوەیەکی گشتی «ژێر» دەکەوێتە نێوان ناوەڵناوو ناوی وەسف کراوەوە. وەک: «ب.ف».

بەڵام ئەگەر وەسف کراو بە پیتی «ا» یا «و» کۆتایی بێ، ئەوا لەم حاڵەتەدا «ی» دەخرێتە کۆتایی وەسف کراوەکە، ئەوجا ناوەڵناوەکە دێت. وەک: «ب.ف».

٥- لەوەیە هەندێ جار فرمانی کۆمەک بکەوێتە نێوان ناوەڵناوو ناوی وەسف کراوەوە. وەک: «ب.ف».

٦- هەندێ جار «ی» ئامرازی نەشوناس، لەگەڵ ئاوەڵناوو وەسف کراودا دێت و ئەم «ی»یە هەندێ جار لە دوای ئاوەڵناوەکەوە دێ و هەندێ جار لە دوای ناوە تەواوکراوە کە وە «موصوف» دێت. وەک: «ب.ف».

**ئاوەڵناو دەبێ بە چەند بەشێکەوە کە باوترینیان بریتین لە:**

**١- ئاوەڵناوی سادە:** ئەوەیە کە بە شێوەیەکی موتڵەق حاڵەتی ناوە تەواو کراوەکەی «موصوف» خۆی دەردەخات. وەک: «ب.ف».

**٢- ئاوەڵناوی جامد:** ئەوەیە کە لە رەگی فرمانەوە وەرنەگیرابێ. وەک: «ب.ف».

**٣- ئاوەڵناوی مشتق:** ئەوەیە کە لە رەگی فرمانەوە وەرگیرابێ. وەک: «ب.ف».

**٤- ئاوەڵناوی بکەر:** ئەوەیە کە دەلالەت لە ئەنجام دەری کار دەکا و نیشانەکانی بریتی‌یە لە:

آ- ندە: ریشەی رانەبوردو+ ندە = ئاوەڵناوی بکەر.

ب- ان: ریشەی رانەبوردو+ ان = ئاوەڵناوی بکەر.

ج- ا: ریشەی رانەبوردو+ ا = ئاوەڵناوی بکەر.

د- ار: ریشەی رانەبوردو+ ار = ئاوەڵناوی بکەر.

ریشەی رابوردو+ ار = ئاوەڵناوی بکەر.

هـ- گار: ریشەی رانەبوردو+ گار = ئاوەڵناوی بکەر.

ریشەی رابوردو+ گار = ئاوەڵناوی بکەر.

و- کار: هەندێ ناو+ کار = ئاوەڵناوی بکەر.

ز- گر: هەندێ ناو+ گر = ئاوەڵناوی بکەر. وەک: «ب.ف».

**تێبینی:**

١- هەندێ پاشگر هەن ئاوەڵناوی بکەر دروست دەکەن. وەک: «ب.ف».

٢- کاتێ ناو یا ئاوەڵناوێکی دی لەسەرەتای ئەو ئاوەڵناوە بکەرانەوە کە بە «ندە» دروست بوون، بێت، نیشانەی «ندە»کە لا دەبرێ. وەک: «ب.ف».

هەڵبەت لە هەندێ ووشەدا ئەم گۆڕانە روو نادات وەک: «ب.ف».

٣- زۆربەی ئاوەڵناوە بکەرەکان موشتەقن، واتە لە رەگی رانەبوردوو یان رەگی فرمانی رابوردوو پاشگر دروست دەبن.

*

**٥- ناوەڵناوی کراو:**

دەلالەت لە کەسێک یان شتێک دەکات کە کارێکی بەسەرداهێنرابێ و نیشانەکەی بریتی‌یە لە «ە». وەک:«ب.ف».

هەندێ جاریش ووشەی «شدە»ی بۆ زیاد دەکرێ. وەک:«ب.ف».

**چۆنێتی دروستکردنی:**

رەگی رابوردوی تێپەڕ +ە= ناوەڵناوی کراو.

رەگی رابوردوی هەندێ فرمانی تێپەڕ +ار= ناوەڵناوی کراو. وەک:«ب.ف».

**تێبینی:**

١- ناوەڵناوی کراو لە فرمانی تێپەڕ دروست دەکرێن. ئەگەر لە فرمانی تێنەپەڕەوە دروست بکرێن، واتای ناوەڵناوی بکەر دەگەیەنن. وەک:«ب.ف».

٢- لە ناوەڵناوی کراوی لێکدراودا هەندێ جار «ە» دەکەوێ. وەک:«ب.ف».

**٦- ناوەڵناوی نسبی:**

هەر ناوەڵناوێک، ناوە تەواوکراوەکەی «موصوف» خۆی بداتە پاڵ شوێنێ، یا کەسێک یا شتێک، ناوەڵناوی نسبی پێ دەڵێن. نیشانەکانی ناوەڵناوی نسبی بریتین لە: «ب.ف».

**٧- ناوەڵناوی بەراورد:**

أ- ناوەڵناوی بالاتر: ئەوەیە کە بالاتری مەوسوفێک بەسەر مەوسوفە هاوجۆرەکانی خۆیدا، نیشان دەدات و نیشانەکەی «تر»ە. «ب.ف»

**ب- ناوەڵناوی بالاترین:** ئەوەیە کە بالاتری مەوسوفێک بەسەر سەرلەبەری مەوسوفە هاوجۆرەکانی خۆیدا نیشان دەدات و نیشانەکەشی «ترین»ە. وەک:«ب.ف».

*

**ناوەڵفرمان و بەشەکانی**

ناوەڵفرمان ووشەیەکە، چۆنێتی و کات و شوێنی روودانی فرمانێک. یا ناوەڵناوێک یا هەر ووشەیەکی دی دەردەبڕێ، ناوەڵفرمان چەند جۆرێکی هەس کە گرنگترینیان بریتین لە:

١- ناوەڵفرمانی کات: ئەوەیە کە کاتی روودانی فرمانی بگەیەنێ.

وەک: «ب.ف».
٢- ناوەڵفرمانی شوێن: ئەوەیە کە شوێنی روودانی فرمان دەربخات. وەک: «ب.ف».
٣- ناوەڵفرمانی ئەندازە: ئەوەیە کە ئەندازەی فرمان بگەیەنێ. وەک: «ب.ف».
٤- ناوەڵفرمانی نەفی: ئەوەیە کە نەفی بگەیەنێ. وەک: «ب.ف».
٥- ناوەڵفرمانی تەکید: ئەوەیە کە فرمان دووپات بکاتەوە. وەک: «ب.ف بروانە فارسییەکە».
٦- ناوەڵفرمانی تەرتیب: ئەوەیە کە تەرتیبی فرمان بگەیەنێ. وەک: «ب.ف».
٧- ناوەڵفرمانی گومان: ئەوەیە کە گومان و دوو دڵی بگەیەنێ. وەک: «ب.ف».
٨- ناوەڵفرمانی وەک یەک: ئەوەیە کە وەک یەکی دەربخات. وەک: «ب.ف».
٩- ناوەڵفرمانی پرس: ئەوەیە کە دەربارەی روودانی فرمان پرسیار بکات. وەک: «ب.ف».
١٠- ناوەڵفرمانی استثناء: وەک: «ب.ف».
١١- ناوەڵفرمانی خۆزیا و حەز: ئەوەیە کە خۆزیای بە ئەنجام گەیشتنی فرمان دەربڕێ. وەک: «ب.ف».
١٢- ناوەڵفرمانی چۆنی: ئەوەیە کە حاڵەتی فرمان یا بەرکار لە کاتی روودانی فرمانەکەدا بگەیەنێ. وەک: «ب.ف».
١٣- ناوەڵفرمانی سوێند: هەر سوێندێک دەگرێتەوە. وەک: «ب.ف».
١٤- ناوەڵفرمانی مەرج، وەک: «ب.ف».

**تێبینی:**

١- ئەگەر پاشگری «انە» بخرێتە پاش ناو یا ناوەڵناوەوە بەزۆری دەبێ بە ناوەڵفرمانی چۆنی. وەک: «ب.ف».
٢- هەندێ ناوەڵفرمان هەن، دەکرێت لەچەمک و مانای رستەوە پەی پێ ببرێ. وەک: «ب.ف».
١٥- ناوەڵفرمانی شادی و داخ: ئەوەیە کە شادی یا داخی قسەکەر دەربارەی بابەتی رستە و بە ئەنجام گەیشتنی فرمان نیشان دەدات. وەک: «ب.ف».

١٦- ناوەڵفرمانی دووبارە: ئەوەیە کە دووبارە بوونەوەی کارێک یا حاڵەتێک نیشان دەدات. وەک:«ب.ف».

*

## پێشگر و پاشگر

پێشگر و پاشگر، پیت و ووشەگە لێکن کە لەپێش یا پاش هەندێ ووشەوە دێن و مانای نوێ دروست دەکەن.

١- پێشگرەکان: پیت و ووشەگەلێکن کە بە پێش ووشەی دییەوە دەلکێن و مانای تازە بە دەستەوە دەدەن، ئێستا دێینە سەر هەندێ لە پێشگرە باوەکان. «ب.ف».

٢- پاشگرەکان: ئەو پیت و ووشانەن کە بەدوای ووشەی دییەوە دەلکێن و مانای تازە بە دەستەوە دەدەن. ئەمەش هەندێ لە پاشگرە باوەکانە: «ب. ف».

٣- ناوگر: باوترین ناوگر «الف»ە کە دەکەوێتە نێوان دووبەشی ووشەوە. وەک:«ب.ف».

*

## دەنگەکان

ئەو ووشانەن کە حاڵەتی دەرونی قسەکەر دەردەبڕن و چونکە چەمکی رستەش دەگرنە خۆ، نیمچە رستەشیان پێ دەڵێن. دەنگەکان زۆر و جۆراوجۆرن و باوترینیان بریتین لە:

١- لەمەڕ ئەفسوس ئازار، وەک:«ب.ف».

٢- لەمەڕ ئاگادارکردنەوە، وەک:«ب.ف».

٣- لەمەڕ بانگکردن، وەک:«ب.ف».

٤- لەمەڕ سەرسوڕمان، وەک:«ب.ف».

٥- لەمەڕ ستایش و ئافەرین، وەک:«ب.ف».

٦- لەمەڕ خۆزی و هێڤی، وەک:«ب.ف».

*

## پیتەکان

پیت، هەندێ ووشەن کە بە زۆری لە ووشەی دی کورتترن و چ مانایەکی سەربەخۆیان نیە، پیت زۆرن کە باوترینیان بریتین لە:

١- پیتی پەیوەند: ئەوەیە کە دوو ووشە یا دوو رستە پێکەوە گرێ دەدا. پیتی پەیوەند دوو جۆرە:

أ- ساده. وەک:«ب.ف».
ب- لێکدراو. وەک:«ب.ف».
**تێبینی:** پیتی «اگر، گر، ار، تا» لەگەڵ رستەی مەرجیدا بەکار دەهێنرێ، بەڵام لە ریزی پیتی پەیوەند دادەنرێن.

*

**٢- پیتی لێکدەر «ئیزافە»**
ووشەیەکە کە لە پێش ناو،یا راناو یا دەستەوڵژەیەکەوە دێ و دەیکا بە تەواوکەری «متمم» فرمان و لە رووی بونیادەوە دوو جۆرە:
أ- پیتی سادەی ئیزافە. وەک:«ب.ف».
**تێبینی:** هەر یەکێک لەم پیتانە بۆ مەبەستێکی تایبەتی بەکار دێ و هەندێکیان مانای جۆراوجۆریان هەیە. وەک:«ب.ف».
ب- پیتی لێکدراوی ئیزافە: وەک:«ب.ف».
**تێبینی:**
١- تا ــ ئەگەر دەلالەت لە کۆتایی کات یا شوێن بکات، پیتی ئیزافەیە، ئەگەر دوو ووشە پێکەوە گرێ بدات پیتی پەیوەندە. وەک:«ب.ف».
٢-را: ئەگەر مانای «از، به، برای» بگەیەنێ پیتی ئیزافەیە. وەک:«ب.ف».
٣- چۆن: ئەگەر مانای «وەک» بگەیەنێ، پیتی ئیزافەیە وەک:«ب.ف».
بەڵام ئەگەر مانای پێکەوە گرێ دانی دوو ووشە بگەیەنێ، ئەوا پیتی پەیوەندە. وەک:«ب.ف».
**٣- پیتی نیشانە:**
ئەوەیە کە بۆ دەست نیشان کردنی پایەی ووشە لە نێو پێکهاتی رستەدا بەکار دەهێنرێ. وەک:«ب.ف».
را: ئەگەر لەگەڵ بەرکاری رستەدا بێ، نیشانەی بەرکارە. وەک:«ب.ف».
**تێبینی:**
١- هەندێ جار بەرکار لەگەڵ «را» دا دێت. وەک:«ب.ف».
٢- هەندێ جار بەرکار بەبێ نیشانە دێ. وەک:«ب.ف».
٣- هەندێ جار بەرکار لەگەڵ «ی» دێت. وەک:«ب.ف».

٤- هەندێ جار بەرکار لەگەڵ «ی» و «را» دا دێ. وەک:«ب.ف».

*

**جیاواز ئیزافە و سیفەت**

١- سیفەت و مەوسوف لە خانەی یەک ناودان، واتە سیفەت لەناو مەوسوفەکەدایە، لە دەرێی مەوسوفەکەدا بونی نیە. وەک:«ب.ف».

موزاف و موزاف ئیلەیهی: دوو شتی تەواو لەیەکتر جیاوازن وەک:«ب.ف».

٢- لە ئیزافەدا ووشەی دووەم «موزاف ئیلەیهی» هەمیشە یا ناو یا راناو یا ناوەڵناوێکی جێگری ناو دەبێ. وەک:«ب.ف».

٣- دەتوانرێ ووشەی «بسیار، سخت» لە پێش سیفەت دا بەکار بهێنرێ و ووشەی «تر» لە دوایەوە بەکار بهێنرێ وەک:«ب.ف». بەڵام ئەم کارە لەگەڵ ئیزافەدا بە هیچ جۆرێ نایەتەکردن. وەک:«ب.ف».

٤- لە کۆتایی دەستەواژەی وەسفیدا، دەتوانرێ یەکێک لە فرمانە یاریدەدەرەکانی «است، بود، شد» بەکار بهێنرێ وەک:«ب.ف».

بەڵام ئەم کارە لەگەڵ دەستەواژەی ئیزافی دا ناگونجێ.

٥ - موزاف ئیلەیهی چونکە ناوە، نیشانەی کۆ وەردەگرێ، بەڵام سیفەت وەری ناگرێ. وەک:«ب.ف».

*

**ژمارە - ژمێردراو**

ژمارە: ووشەیەکە کە بۆ ژماردنی کەس یا گیانلەبەر یا شت بەکار دێ. وەک:«ب.ف».

ژمێردراو: ئەوەیە کە بەهۆی ژمارەوە، ژمارەکەی بەیان دەکرێ.

**ژمارە چوار جۆری هەیە:**

١- ژمارەی بنجی «اصلی» بریتیە لە «٢٠» ووشە: ١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧، ٨، ٩، ١٠، ٢٠، ٣٠، ٤٠، ٥٠، ٦٠، ٧٠، ٨٠، ٩٠، ١٠٠، ١٠٠٠.

ژمارەکانی تری وەک: ١١، ١٢، ١٣.. سەدهەزار. لە لێکدانی ژمارە بنجیەکانەوە بەدەست هاتوون.

**تێبنی:**

١- ژمێردراوی، ژمارەی بنجی هەمیشە لە دوای ژمارەکەوە دێ و هەمیشە تاکە. وەک:«ب.ف».

٢- ووشەی «چند، چندان، چندی و چندین» ژمارەی نادیار نیشان دەدەن. وەک: «ب.ف».

*

## ٢- ژمارەی تەرتیبی « وەسفی»

ئەوەیە کە تەرتیبی ژمێردراو پیشان بدات. وەک: «ب.ف».

**تێبینی:** ژمارەی تەرتیبی، هەر ژمارەی بنجی‌یە کە دوا پیتی بۆری «ــــــُـ» خراوەتە سەرو دوای ئەوە پیتی «م»ی بۆ زیاد کراوە. وەک: «ب.ف».

* ژمارەی تەرتیبی هەم لە دوای ژمێردراوەوە و هەم لە دوای ژمێردراوەوە دێت. وەک: «ب.ف».

* لە کۆتایی ژمارەی «سی» یەوە ووشەی «ام» بەکار دەهێنرێ. وەک: «ب.ف».

**٣- ژمارەی کەسی:** ئەوەیە کە بەشێک لەژمارەی تەواو پیشان بدات. وەک: « ب. ف»

ئەمڕۆ ژمارەی کەسیر لە شێوەی ژمارەی تەرتیبی شدا بەکار دەهێنن. وەک: «ب.ف»

**٤- ژمارەی تەوزیعی:** ئەوەیە کە ژمێردراوەکەی خۆی بکات بە بەشی یەکسانەوە وەک: «ب.ف».

هەندێ جار پاشگری «گان» دەخرێتە سەر ژمارەی «بنجی» و دەبێ بە ژمارەی تەوزیعی. وەک: «ب.ف».

**تێبینی:**

١- هەندێ جار ووشە «اند» بەرچاو دەکەوێ، ئەم ووشەیە بە مانای لە (٣-٩) بەکار هاتووە. وەک: «ب.ف».

٢- هەرگاتێ دوو ژمارە یا چەند ژمارەیەک دەربارەی دوو دلی و زارایی بەکار بێت، هەمیشە ژمارە بچوکەکە پێش دەخرێ. وەک: «ب.ف».

٣- بۆ پیشان دانی ژمێردراوو جیاکردنەوەیان، هەندێ زاراوەی تایبەتی لە بەکارهێناندا جێ گیربوون کە ئەمە هەندێ نموونەی ئەو زاراوانەن:

* بۆ مرۆڤ: تن، نفر، بەکار دێت. وەک: «ب.ف».
* بۆ چوارپێ «راس وسر» بەکار دێت. وەک: «ب.ف».

* بۆ شمشێر و کێرد و تفەنگ « قبضە» بەکار دێت. وەک: «ب.ف».
* بۆ تۆپ و تانک « عرادە» بەکار دێت. وەک: «ب.ف».
* بۆ کەشتی و فڕۆکە. «فروند» بەکار دێت. وەک: «ب.ف».
* بۆ ئەنگوستیلە وبیر «حلقە» بەکار دێت. وەک: «ب.ف».
* بۆ دەست کێش وگۆرەوی «زوج، جفت» بەکار دێت وەک: «ب.ف».
* بۆ ئوتۆمبێل وعارەبانە و تەلەفۆن، سەعات و شتی ئوتوماتیکی «دسگاە» بەکار دێت. وەک: «ب.ف».
* بۆ ئاپارتمان و تەلار و خانووبەرە « باب» بەکار دێت. وەک: «ب.ف».
* بۆ دۆشەک و لێفە و فەرش « تختە» بەکار دێت. وەک: «ب.ف».
* بۆ کتێب «جلد» بەکار دێت. وەک: «ب.ف».
* بۆ زەوی «قطعە» بەکار دێت. وەک: «ب.ف».
* بۆ قوماش «قوارە» بەکار دێت. وەک: «ب.ف».
* کۆکردنەوە «ها» وەک «ب.ف».
* لێ دەرهێنان «منها». وەک: «ب.ف».
* لێدەرهێنان «از». وەک: «ب.ف».
* کەرەت «تا». وەک: «ب.ف».
* دابەش کردن «تقسیم بر». وەک: «ب.ف».

**ماخذ**

کتابها و مجلەهایی کە در نوشتن این اثر از آنها استفادە شدەاست:
١- عمید، حسن. فرهنگ عمید. تهران ١٣٦٢
٢- مشکور، دکتر محمد جواد . تهران ١٣٤٦ دستورنامە
٣- برناک، علي. دستور زبان فارسی و راهنمای تجزیە و ترکیب ١٣٤٦
٤- الزهتابی، د. محمد تقی « قواعد اللغە الفارسیة، النجف الاشرف، محفوظ. د. حسین علي و ادابها .١٩٧٣
٥- عابر پیادە ، مجموعە داستان . ترجمە سلیمان محسن. تهران ١٣٦٨ .
٦- کیهان بچەها. سال سی وششم . دورە جدید، شمارە ٦٢٣
٧- دستور زبان فارسی، ٥٠ مثال تجزیە و ترکیب. مولوی، عباسعلی.

چاپ پانزدهم ۱۳۷۰ چاپخانه اتحاد.
۸- دراسات في اللغة و الشعر و النثر الفارسي، الجزء الاول . ابو معلي د. محمد وصفي. مطبعة جامعة البصرة ۱۹۸۷
۹- برگزيده نظم و نثر فارسي. بكوشش: موتابچي. د. امين. دانشكده ادبيات بغداد. ۱۹۷۱م. مطبعة النعمان. النجف الاشرف.
۱۰ تيفوس و چند داستان ديگر. چخوف، آنتوان. ترجمه: ع - اشرافى چاپ سوم ، تهران ۱۳۵۵ .
۱۱- دستور زبان فارسى. چاپ سيزدهم ۱۳۷۲ ، انتشارات توس، چاپخانه حيدرى، خانلرى. د. پرويز ناتل.
۱۲- فارسى و دستور. سال سوم، دوره راهنمايى تحصيلى ۱۳۷۰
۱۳- فارسى و دستور سال دوم دوره، راهنمايى تحصيلى ۱۳۷۲
۱٤- قصه‌هاى بهرنگ. بهرنگى صمد....
۱۵- داستانهايى براى بچه‌ها. تولستوى، لئو. ترجمه: س. صارمى. چاپ اول ۱۳٦۸تهران.
۱٦- دستور زبان فارسى. ۱۳٦٤ شهبازى. د. على
۱۷- فارسى و دستور. سال اول دوره راهنمايى تحصيلى
۱۸- دستور زبان فارسى، پنج استاد «عبدالعظيم قريب، ملك الشعراء بهار، بديع الزمان فروزانفر، جلال همائى، رشيد ياسمى، چاپ اول ۱۳۷۱ ، چاپخانه: حيدر على».
۱۹- نگارش و دستور زبان فارسى . سال دوم. اموزش متوسطه عمومى. ادبيات و علوم انسانى. مؤلف: گرد فرامرزى د. على سلطانى.
۲۰ دەستور و فەرهەنگى زمانى كوردى - عەرەبى، فارسى. سجادى، علاالدين. چاپخانەى مەعارف- بەغدا ۱۹٦۲ .

## حەمە کەریم عارف

* کەرکوکییە و لە ساڵی ١٩٥١ دا لە دایک بووە.
* لە ساڵی ١٩٧٥دا کۆلێژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردوە.
* لە ساڵی ١٩٧٧ وە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاودەکاتەوە.
* نۆ ساڵی هەرەتی لاوی، بێ وابە ستەگی حیزبی، لە پێشمەرگایەتیدا بەسەر بردووەو، وەکو بەشداریەکی مەیدانی و، ویژدانی لە خەباتی ڕەوای نەتەوەی کورد دا، شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە ڕۆڵەی میللەتی مەزلوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.
* جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکوک، نووسەری کوردستان، کەلتور، ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢ بە ناوی: گۆڤەند، زنار، سیهان، پاکزاد، محمدی حاجی، سەروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێرا، ح.ع بەرهەمی بڵاو کردۆتەوە.
* لە هەشتاکانەوە تا ئێستا ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکوکی یەکێتی نووسەرانی کوردی کردووە.
* زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردۆتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان بە نوسخەی هێندە کەم بڵاوبوونەتەوە، لە نرخی نەبوودان..

تەنیا ئەوەندەیە لە فەوتان رزگاربوون و هیچی دی، هەندێک لە وانە:

١- تیرۆژ، کۆ چیرۆک.
٢- کۆچی سوور، چیرۆک.
٣- بەیداخ، چیرۆک.
٤- داوەتی کۆچەریان، کۆ چیرۆک.
٥- لەخۆ بێگانە بوون، کۆ چیرۆک.
٦- کوچ سرخ، کۆ چیرۆک بە فارسی.

وەرگێڕان:
٧- نینا، رۆمانی سابت رەحمان.
٨- ئامۆ، رۆمانی ئەلبێر کامۆ.
٩- رێبەر، رۆمانی مەهدی حسێن.
١٠- شکست، رۆمانی ئەلکساندەر فەیداف.
١١- هاومالەکان، رۆمانی ئەحمەد مەحمودی «بەرگی ١».
١٢- بێناسنامەکان، رۆمانی عەزیز نەسین.
١٣- قوربانی، رۆمانی هێرب میدو.
١٤- دوورە وولات، رۆمانی ع. قاسمۆف.
١٥- ئازادی یا مەرگ، رۆمانی کازانتراکیس.
١٦- هاومالەکان، ئەحمەد مەحمود «بەرگی ٢»
١٧- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، بەرگی یەکەم.
١٨- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، بەرگی دووەم.
١٩- ئامالجی ئەدەبیات، م. گۆرکی.
٢٠- دلێری خۆ ڕاگرتن، یاداشتنامەی ئەشرەفی دەهقانی.
٢١- مەسەلەی کورد لە عێراقدا، عەزیز شەریف.
٢٢- مێژوی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا.
٢٣- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعود ئەحمەد زادە.
٢٤- کورد، گەلی لەخشتە براوی غەدر لێ کراو، د.گوینتەر دێشنەر.
٢٥- لەمەهابادی خوێناویەوە بۆ کەنارێن ئاراس. نەجەف قولی پسیان.
٢٦- گوزارشتی موسیقا، د. فواد زەکەریا.
٢٧- دەرباری شیعرو شاعیر، رەزا بەراهەنی.
٢٨- ڤنست ڤان گوگ، شانۆنامە، پاول ئایزلەر.
٢٩- بەدوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل ئەلقەیسی.
٣٠- جولەکەکەدی مالتە، شانۆنامە، مالرو.
٣١- داد پەروەران، شانۆنامە، ئەلبێر کامۆ.

٣٢- بەد حاڵی بوون، شانۆنامە. ئەلبێر کامۆ.
٣٣- چاو بەچاو، شانۆنامە، گەوهەر موراد «غولام حوسێن ساعدی».
٣٤- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە. شکسپێر.
٣٥-گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوڵلا ئەلبوصێری «لەهەشتاکانەوە لای کاک مەحمود زامدارە».
٣٦- کورد لەئەنسکلۆپیدیای ئیسلام دا.
٣٧- هونەر و ژیانی کۆمەڵایەتی. پلیخانۆف.
٣٨- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت. ئیڤلین رید.
٣٩- لێکدانەوەیەک لەمەر ناموی ئەلبێر کامۆ.
٤٠- منداڵە دارینە، چیرۆکێکی درێژە بۆ منداڵان.
٤١- فاشیزم چی یە، کۆ چیرۆک بۆ منداڵان، یەڵماز گونەی.
٤٢- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بومنداڵان.
٤٣- دوژمنان، دوو کۆ چیرۆکی چیخۆف.
٤٤-ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی.
٤٥- هەڵبژاردەی چیرۆکی فارسی(١) کۆ چیرۆک: لالە، گێژاو، جێ پێ، کورتە مێژووکی ژوورەکەم، کتێب.
٤٦- چوار چیرۆک و هەڵسەنگاندنیان: کامۆ، موپاسان، پیراندیللو، چیخۆف.
٤٧- چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، حەمەکەریم عارف.
٤٨- فەرهەنگی فارسی کوردی پیتی(ا-١)، حەمەکەریم عارف.
٤٩- نوسینێت پەراگەندە «کۆمەڵە نوسینێکی هەمەجۆرە»، حەمەکەریم عارف.
٥٠- چەندین چیرۆکی بێگانە.
٥١- چرنیشڤسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس.
٥٢- چایکوفسکی، ژیان و بەرهەمی.
٥٣- صادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی.
٥٤- خافروغ لە شیعر دەدوێ، ژیان و بەرهەمی.
٥٥- رێبازە هونەریەکانی جیهان.

٥٦- ئەدگارئالن پۆ، ژیان و بەرهەمی.
٥٧- یەلماز گونەی هونەرمەندی شۆڕشگێر، ژیان و بەرهەمی.
٥٨- ئەهلی دۆزەخ، جاک لەندەن، ژیانی بەرهەمی.
٥٩- ریالیزم و دژە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا.
٦٠- کۆمەڵێک ئەفسانەی جیهانی.

* لەراپەڕینەوە تا ئەوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیری کوردی دەکات و بەرهەمی هەمە جۆری نووسراو و وەرگێردراو بلاودەکاتەوە، بەتایبەتی لە رۆژنامەو گۆڤاری: برایەتی، خەبات ، رێگای کوردستان، پەیان، دەنگی میللەت، رامان، گولان، کاروان، مەتین، گازی، پەیڤ، سەنتەری برایەتی، رۆژنامەی یەکبوون.

* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و هەرکەس وگروپ و لایەنێک تەماحی بلاوکردنەوەی هەبن ،ئامادەیە بەخۆڕایی پێشکەشیان بکات...